# نەوبەهاری خانی
# و
# ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدی



لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی

عەلی فەتاح دزەیی



# بەشی یەکەم
# نەوبـــەهارا بچووکان
# ی
# ئەحمەدی خانـــی
# ١٦٥٠ _ ١٧٠٦

« کۆنترین فەرهەنگ و هـەم کۆنترین
سەرچاوەی زانیاری عەرووزە لە زمانی کـوردیدا »

# تێبینی یەکی پێویست

لە ساڵانی ١٩٧١ ـ ١٩٧٢دا ئەم نامیلکـەو باسێکـی درێژتـری دیکەم لە بارەی مەم‌و زینی (خانی)وە نووسیوە • ئەمەیانم لە ساڵی ١٩٧٣دا بۆ چـاپکردن ئامـادە کردبوو بەڵام هەنـدێ ڕووداوی تایبەت بـوون بەهۆی ئەوەی کـە سپێنووسەکـەی ئامادە کـراو لە ناو بچێت‌و ڕەشنووسەکەی بمێنێتەوە • جگە لەمەش ، لە ساڵانی ١٩٧٥ ـ ١٩٨٣دا ، بەوەزیفە لە خوارووی وولات بووم‌و بـۆم نەلوابوو کەڕۆژ بەڕۆژ سۆراخی چاپەمەنی‌یە تازەکانـی کـوردی بکەم • ئەوە بوو تاسەر لەنـوێ لـە سپێنووس کـردنەوەی ئـەم نامیلکەیـە نەبوومـەوە ( کانوونی دووەمـی ئیمسال ـ ١٩٨٤ ) ئەم بیستبوو کە خوالێخۆشبـوو مامۆستا (سـادق بەهانـوددیـن) بەیاریدەی کۆڕی زانیاری کورد لە ساڵی ١٩٧٩ دا ، (نەوبەهار) ی‌چاپ کردۆتەوەو ، چاپەکەی دیمەشـق ـ کەلێـرەدا باسـم لێوەکردووە ، لەگەڵ چەند تێکستی دیکەی دەسـتخەتی بەراوورد کـردووە •

بەهۆی ئەوەی کە ئەم باسە ، لێکۆڵینەوەیەکە لـە ( نەوبەهـار ) و تەنانەت لەو پێشەکی یەی کە مامۆستای خوالێخۆشبوو بۆچاپەکەی نووسیوە جیاوازە ،بەپێویستم نەزانی چاو بەم نامیلکەدا بگێڕمەوە یاخۆ هیـچ دەسکاری‌یەکـی تیادا بکـەم • ئەمجا بۆ خـوێنـەری ڕەخنەگر ئەم ڕوونکردنەوەیەم بەپێویـسـت زانی‌و، مەبـەستـی سەرەکیش خزمەت ـ کردنی زمانە شیرینەکەمانە •

دانەر

هەولێر ـ ٢٥ ـ ١ ـ ٩٨٤

# پێشەکی

جگە لە داستانی (مەم و زین)، شاعیری گەورەمان (ئەحمەدی خانی) دوو نامیلکەشی داناوە، یەکێك بەناوی (عقیدا ئیمانێ)[1] ئەویتریان بەناوی (نەوبەهارا بچووکان)[2]. نامیلکەی یەکەمیان وەکو لە ناوەکەیەوە دیارە لەبارەی باوەڕی و ئایینی ئیسلامەو دوور نیە بەتایبەت بۆ شاگردانی دانابێ. لەبەر ئەوەی خۆم نامیلکەکەم نەدیتووە ناتوانم هیچی دیکەلەبارەیەوە بنووسم. بەواتەی مامۆستا عەلائوددین سەجادی لە (٧١) بەیت هۆنراوە پێکهاتووە.

نامیلکەی دووەمیان لە ئەوی پێشوو گەلێك بەناوبانگترە. ئەدیبی گەورە (حەمزە) لە دیباچەی چاپی یەکەمی (مەم و زین‌دا ـ ئەستەمبۆل ـ ١٩١٩)، باسی کردووەو سالی (١٠٩٤ کۆچی = ١٦٨٢ میلاد)ی، بە مێژووی نووسینی داناوە. ئەمین زەکی بەگ ئەم مێژووەی بە سالی لەچاپدانی لەلایەن (یوسف ضیا بەگ)ەوەلەقەلەمداوە. (موحەمەدعەلی عەونی)یش، لەپەراوێزی لاپەڕە(٣٥٥)ی(خلاصة تاريخ الكرد والكردستان)دا زانیاریەکەی

---

(١) مێژووی ئەدەبی کوردی لـ٢٠١ شایانی باسە ئەم نامیلکەیە لەلایەن خوالێخۆشبوو مامۆستا (سادق بهاءالدين ئامێدی) کۆکراوەتەوەو لە پاشکۆی (مەولوودا مەلایی باتەیی)دا چاپ کراوە. ژمارەی بەیتەکانی (٧٣ + ٤ + ٦ = ٨٣) بەیتن. لاموایە لەبنەڕەتا هەر (٧٣) بەیت دەبن. بەیتە زیادەکان کێشیان جودایە ـ دانەر.

(٢) کێشەیەك لەسەر ناوی ئەم فەرهەنگۆکە هەیە. (موحەممەد ئەمین بۆز ئەرسەلان لە پێشەکۆتنی مەم و زین‌دا (چاپی ئەستەمبۆل ـ سالی ١٩٦٨). ناوەکەی بە (نووبار ـ (NUBAR) ) تۆمارکردووە. دکتۆر کەمال فوئاد)یش هەمان باوەڕی هەیە بەڵام لەبەر ئەوەی لەچاپەکەی بەردەستمدا ناوی بە (نەوبەهار = نوبهار) هاتووە، نەمویست دەستکاریی ناوەکەی بکەم. (دانەر)

مێژوونووسی گەورەمانی ڕاستکردۆتەوەو، ڕوونیکردۆتەوە.
کە ئەمە مێژووی دانانیەتی نەك لە چاپدانی،
ڕاستی‌یەکەی (خانی) لە کۆتایی نامیلکەکەیدا بەشێوەیەکی زۆر سەیرو وورد، مێژووی دانانیتۆمارکردووە کەساڵی(١٠٩٤کۆچی) دەگرێتەوە ئەمەش بەرامبەر بە ساڵی (١٦٨٢)ی میلادە ٠
ئەوچاپەی کەئێستاکە لەبەردەستمدایە(٣٨)لاپەڕەی قەوارەبچووکە (١٣ سم × ١٩ سم ) ٠ لاپەڕەی یەکەمی ڕووبەرگی‌یەتی‌و ئەوی دوای‌یان هیچی لەسەر نەنووسراوە ٠ تێکستەکەی (٣٦) لاپەڕەی بەتیپی درشت پڕکردۆتەوە ٠ ( مەلا عەبدولسەلام جەزیری [٣] مەتنەکەی راستکردۆتەوەو سەروژێری بۆ هەموو ووشەکان داناوەو ( موحەحمەد رەمەزان کوردی بۆتی ) ٠ لەسەر ئەرکی خۆی لە چاپخانەی ( دار الطباعه ) لە شاری ( دیمەشق ) چاپی کردووە ٠
زۆر جێگای داخە کە ئەم جوامێرانە سەرەتایەکیان بۆ چاپەکە نەنووسیوەو باسی دەستخەتی ئەسلی‌ی نامیلکەکەیان نەکردووە ٠ تەنانەت لەسەر رووبەرگەکەیدا ساڵی لەچاپدانیشیان دیاری نەکردووە ٠ بەڵام بێگومان ئەم چاپە ئەوە نیە کە ( ئەمین زەکی بەگ) باسی لێوەکردووە ٠
لەم چاپەدا، هەموو ووشەکانی کوردیشس ، بەڕێنووسی کۆن نووسراون و سەروژێریان بۆدانراوە ٠ وادیارە ئەو وەختەهێشتا بۆ دەنگی (گ)ی کوردی ئەم نیشانەیە نەبووە (یا ئەوان پێیان نەزانیوە) بۆیەکا وەکو چاپەمەنی‌یەکانی کۆنی فارسیی، بۆ ئەم

---

(٣) زانایەکی گەورەی کورد بووە ساڵی(١٨٧٨) لە شاری(جەزیری) بۆتان لە دایك بووەو ساڵی (١٩٥٢) لەشاری قامیشلی،لەسوریا کۆچی‌کردووە (نووسەری کورد ـ ژمارە ـ٧ ـ ل٠ ٥٠ـ٥٢)

مەبەستە،سێ نوختەیان لەسەر پیتی (ک) داناوەو پیتی (کاف)یان بەم شێوەیە نووسیوە(ڭ)٠ سەرەڕای ئەمەش هـەمـوو ( ة )یە خڕەکانی ووشەکانی عارەبی کـراون بە (ت)ی درێژ؛ بـە وینە، ووشەی (زوجة) بە(زوجت) نووسراوە٠ هەڵبـەت ئەوەم بـۆ ساغ نەبۆتەوە ،ئایا ئەمە رێنووسی دەستخەتی چاپەکە بووە یاخۆ هـی (مەلا عەبدوسەلام) هەروەها، لە هەندێ ووشاندا پیتی (ذ) بووە بە(ز)و، (زراع) لە جیاتی (ذراع) نووسراوە ٠ ٠
بێگومان ئەم چاپە لە هەڵەو کەمو کورتی چاپکاری بێ بەش نیە ، بەڵام- جگە لە چەند ووشەیەك نەبێ- هەرخوێنەرێـك دەتوانـێ ووشە چەوتەکان راستبکاتەوە:

## بابەتی وێژەیی نەوبەهارو بەشەکانی

هەتاکو ئێستاکە، ئەم نامیلکەیە بەفەرهەنگۆکەکی عارەبی- کوردی لەقەلەم دراوەو بەس ٠ تەنانەت دانەرەکەشی ئەم لایەنەی پتر مەبەستبووە بۆیەکا لەسەرەتاکەیدا گوتوویە:

ژ پـاش حـەمـدو سـەلاواتـان
ئـەڤ چەنـد کەلیمـەنە ژ لـوغـاتان
لیـك ئێخسـتن ئـەحمـەدی خـانـی
نالـی نەوبەهارا بچوو کان لێ‌دانی ٠

کەچی باوەڕیم وەهایە کە نرخی (نەوبەهار) ، لە سامانی شیعرو وێژەی کوردیدا لەمە کەلێك پتـرە ٠
ئەم فەرهەنگە، لە دیباچەیەكو لە سێـزدە پارچـە (قطعـة)و لە کۆتاییەیەك پێکهاتووە٠ لەبەرئەوەی کە لە قالـبی هۆنـراودا

(نظم) ڕێکخراوەو،بۆ ئەوەی‌واتای (شیعر)و (نظم) تێکەڵاو نەکرێن
بە پێویستی دەزانم بەکورتی ئەم لایەنە روون بکەمەوە،
لەسەردەمی یۆنانی‌یەکانەوە، (ئەریستۆ)ی دانا، لە کتێبی شیعر
(پۆیتیکا) یدا ،ستووری نێوانی شیعرو بابەتەکانی دیکەی ئەدەبی‌ی
دیاری‌کردووە • لەلای ئەم، شیعر ئەوەیە کە سەرەڕای
کێش(وەزن) ناوەروکێك‌و شێواز(اسلوب)ێکی شیعری هەبێت •
مەبەستیشی لەناوەڕۆکی شیعری ئەو جۆرە باسانە بوون کە
مەیدانێکی فراوان بوون بۆ خەیالبازی ( imagery )وەکو
داستان ( epic )و تراژیدی ( tragedy ) ــمەبەستیشی
لە شێوازی شیعری ، بەکارهێنانی ووردەکاری‌یەکانی بەلاغەت
بووە ( figuers of speech )[٤] کەچی هۆنراوە(نظم)
ئەوەیە کە تەنیا کێشی هەبێت‌و بەس • چونکە لە بنەڕەتا شیعری
یۆنانی قافیە(سەروا)ی نەبووە، بابەتە شیعری‌بێ‌قافیەی ئێستاکەی
ئاوروپایی کە پی‌ی دەگوترێ (بلانك ڤێرس ــ blank verse )
پاشماوەی ئەوسەردەمە•
لە ئەدەب‌و وێژەی نەتەوەکانی ئیسلامدا، ئەوەی (شیعر) لە
(نظم)جودا دەکاتەوە ناوەڕوك وشێوازن، ئەگینا هەردووبابەتەکان
کێش‌و قافیەیان هەیە• ئەمجا ئەگەر (مەم‌و زین)ی خانی بکەین‌بە
نموونەی کردارێکی شیعری، (ئەلفیەی ابن‌مالك)یش دەکەین بە
نموونەی‌کردارێکی‌هۆنراوە، چونکە داڕشتنی ڕێزمان‌و دەستووری
زمانی‌عارەبی‌لەهەزار بەیتی کێشدارو قافیەداردا، هیچ تام‌و بۆیەکی
شیعری‌بەناوەڕۆکەکەی نابەخشن •

---

(٤) ارسطوطاليس ـ فن الشعر (ص٥٦ـ٦٤): ترجمه الدكتور عبد الرحمن بەدوی و هەروها .
An Introduction to Poetry : (P 8 ) : Jacob Korg .

کەواتا، هەموو شیعرێك هۆنراوە، بەڵام هەموو هۆنراوێك شیعر نیە، ئەمجابەپێی ئەم ڕوونکرنەوەیە، فەرهەنگی (نەوبەهار)یش گردارێکی هۆنراوەیە، گەرچی هەندێ بەیتی ئەوتۆی تێداهەن کە واتای شیعر بدەن •

وەکو لە پێشەوە باسمان کرد، ئەم نامیلکەیە لە دیباچەیەك و لە سێزدە (١٣) پارچەو لە کۆتاییەك پێکهاتووە • ئەمەش بە پێوانەی (ئەرستۆ)، درێژاییەکەیەتی، چونکە سەرەڕای درێژایی هەرکردارێکی وێژەیی ناوەرۆکێکی هەیەو لە قالبێکی تایبەتدا داڕێژراوە • بۆیەکە، پێش ئەوەی باس لە ناورۆك و لەقالبەکەی بکەین، بەکورتی بەشەکانی دەخەینە بەرچاو •

### ١- دیباچە (پێشەکی)[٥]

لە چاپەکەدا، ئەم پاچەیە لەسەر شێوەی هۆنراو (نەزم) لە چاپدراوە کەچی بەلای منەوە، بەهۆنراو ناژمێردرێت : لەبەر ئەوەی جگە لەچەند دێڕێك . ئەوانیتر لەسەر هیچ کێشێکی عەرووزی (عروض) یاخۆ بڕگەیی کوردی نین، ڕاستییەکەی (٢٨) بیست و هەشت دێڕ پەخشانی سەجعدارن •

خانی لێرەدا نیشانی داوە نامیلکەکەی بۆ منداڵە بچووکەکانی کورد داناوە نەك بۆ کەسانی پایەدار • مەبەستیشی لەم پایەدارانە ئەوانە بوون کە زمانەکانی بێگانەیان لە زمانی زکماکی خۆیانیان پەسەندتر دەکرد • هەروەها، پایەی خوێندنی نامیلکەکەی خستۆتە دووای خوێندنی (قورئانی پیرۆز)، بۆ ئەوەی شاگردە بچکۆلەکانی کورد، هەم فێری هەندێ زانیاری

---

(٥) خانی ناوی دیباچەو کۆتایی بۆ پارچەکانی مەبەست دانەناوە • (دانەر)

ئایینی و هەم فێری هەندێ ووشەو زاراوی زمانی عارەبی بکرێن پێش ئەوەی دەست بە خوێندنی رێك وپیك بکەن لە حوجرە و قوتابخانەکاندا ٠ ئەمەش تەواوی پێشەکیەکەیە بەرێنوسی تازە:

بسم الله الرحمن الرحیم

مەبدەئی هەر عیلمەکی نالی عەلیم
حەمدو ثەناوو شوکرانی
ژ بۆ وی خالیقی رەحمانی
کو فەصاحەت و بەیان دایە لیسانی
لیسان دایە ئینسانی
هەندی صەلاواتن هەمی
ل رەسوولی مە ئی ئوممی
کو بوونە پێرەوێدوی
عەرەب و عەجەم و کرمانج و رۆمی
ژ پاش حەمدو صەلاواتان
ئەڤ چەند کە لیمەنە ژ لوغاتان
لێك ئێخستن ئەحمەدی خانی
نالی ئەوبەهارا بچووکان لێدانی
نە ژبۆ صاحیبی رەواجان
بەلکە ژ بۆ بچووکێت کرمانجان
وەکی ژ قورئانی خلاص بن
لازمە ل سەوادێ چاڤ ناس بن
دا بلسان رەشبەلەکان
ل وان تەبیعەت مەلەکان
دەری زیهنێ ڤەبیکن

هەرچی بخوونت‌زەحمەتی نەبیتن
کــرو مــــە عــەمەل بـــطـــالان
ئــومێدامە ژ توفالان
دوەڵەتـــی دەورو دەرســـــان
بکــەن ئـیـنـعـسـامو ئـیحـسـان
ب دووعـــان مـــە بـیــری بـیـنـن
ڤـاتـیـحـان ژمــەرا بـخـوونـن

## ۲ ـ پارچەکـان ۰

جگە لە پێشــەکی‌یەکــە ، نەوبەهــار لــە سێزدە پارچانــدا رێکخراوەو سـەرجەمی هەموو پارچەکان ( ۲۰۱ ) دووسەدو یەك بەیت هــۆنراوە ۰ هەرپارچەیەکیش لەســەر کێشێکی عەرووزی جیاوازەو بە دوو بەیتی سەرەتایی دەست پێ‌دەکــات تیادا نــاوی کێشەکەو تەفعیلەکانی دیاری دەکات ۰

بەتنی لەرەنگی هەر پارچەیەکیش ، دووای دوو بەیتەکانی ســەرەتایی‌یان لــە شێوەی هۆنراوێکی یــەك قافیەدا رێکخراوە ، مەگەر پارچەی سێزدەمەمی نەبێت کــە بابەتی قافیەی بەیتەکانی مەسنەوی‌یە۰ پارچەی یەکەم لە سێزدە بەیت پێکهاتووەو دووانیان بەیتەکانی سەرەتایین.لەم پارچەیەدا باس لەســەر گوزەشتەیەکی کورتی پێغەمبەر ( ســلاوی خــودای لێ‌بێت ) کراوە ۰ هەروەها ناوی هەرچــووار خەلیفەکانی و ناوی هــەرچووار پێشەواکانی ئەهلــی ســونــنەت‌و نــاوی هــەر(دە) یــارانی مزدەپێدراو (العشرة المبشرة)ی‌تیادا هاتووە ۰ سێ(۳) بەیتەکــانــی کۆتایــی پارچەی سێزدەهەمیش نزاو پاڕانەوەیە ۰

ئەمجا گەر(۱۳)سێزدە بەیتەکانی‌پارچەی یەکەم‌و(۲٤) بیست‌و

چووار بەیتەکانی سەرەتایی هەر دوانزدە پارچەکانیکەو ( ٣ ) سێ بەیتەکانی کۆتایی پارچەی سێزدەهەم، لەسەر جەمی بەیتەکانی نامیلکەکە دەر بهێندرێن ، ئەوا (١٦١) سەدوشەستو یەك بەیت هۆنراو دەمێننەوە کە تێکستی فەرهەنگی (نەوبەهار) پێکدەهێنن ئەمانەش نزیکەی ( ن٩٠٠ ) ووشەی عارەبی بەرامبەر بەنزیکەی ( ٧٠٠ ) حەوت سەد ووشەی کوردییان تێدا هەیە ٠

## ٣ـ کۆتایی ٠

خانی بەم چەند دێرانەی خوارەوە کۆتایی بە نەوبەهار هێناوە:
«ئەڤ رەنگە(دبێژت)خانی ٠ ئەگەر توو ب ئیدعانی ٠ بفکرە ل کتیبا ثانی ٠ دجلدێ ئەوەلدا٠ ژ جوزئی عاشرو دوەرەقاچارێدا ژ سەحیفا دەستی راستی د سەتری ثالثدە ٠ ژ کەلیما ثانی ٠ بگرتوو حەرفا چارێ ٠ ئەوە تاریخ ژبۆ نەوبەهارێ٠» واتای ئەم نوسینەش، لە چاپەکەدا بە چەند قەیدو پەراوێزی عارەبی لێکدراوەتەوە، بێ ئەوەی قەیدو پەراوێزەکان بدرێنە پاڵ(خانی) یاخۆ کەسێکیتر٠ باوەڕیم ئەوەیەکەخانی بەخۆی و لەدەستنوسەکەی خۆیدا، ئەم پەراوێزانەی تۆمار کردووەو، واتای دێرەکانی سەرەوەی روون کردۆتەوە ، ئەمەش بەم جۆرەی خوارەوەیە :

١ ـل کتیبا ثانی = لە هەزار ساڵی دووەمی کۆچیدا
٢ ـد جلدێ ئەوەلدا = لەسەد ساڵی یێکەمی ئەو هەزار ساڵی دووەم
٣ ـژ جوزئی عاشر =لە (دە) ساڵی دەیەمینی ئەو سەد ساڵی یەکەم
٤ ـد ومرەقا چارێدە= لە ساڵی چووارەمی ئەو دە ساڵی دەهەمیندا
٥ ـژسەحیفا دەستی راستێ=لەشەش مانگی پێشەوەی ئەوساڵی چوارەم
٦ ـد سطری ثالثدە = لە مانگی سێیەمینی ئەو شەش مانگەدا
٧ ـژ کەلیما ثانی = لە (دە) رۆژەی دووەمینی ئەو مانگی سێیەم

٨ ـبگـر توو حەرفا چارێ ٌ ڕۆژی چووارەم لـەو دە ڕۆژەی دوومەی مانگی سێیەم بگرەو :

٩ ـئەوە تاریخ ژ بۆ نەوبەهارێ =ئەمە مێژووی دانانی نەوبەهـارە :

ئەم لێکدانەوەیە ، ڕۆژی چواردەی مانگی سێیەم ( ربیع الأوّل ) سالی ( ١٠٩٤ ) کـۆچی دەگرێتەوە ، کـە بەرامبەر بـە سـالی ( ١٦٨٢ ) میلادە • شایانی باسە ئەوە بلێین کە (خانی )لە پایانی ( مەم و زین ) دا گـوتوویە کـە لەسـالی ( ١٠٦١ ) هـەزارو شـەست و یەکی کۆچیدا لە دایك بـووە و لە تەمەنی چل و چوار سالێـدا واتا لـە سالـی ١١٠٥ کۆچـی ) لە دانانـی مەمورزیـن بـووەتـەوە :

لـەورا کـو دەما ژغـەیبێ فـەك بـوو
تاریخ هـەزارو شـەسـت و یەك بـوو
ئیسـاڵ کـەهێشتـە چـل و چـاران
وی پـێشـرەوی گـونـاهـکـاران

کەواتا دەبێ لە تەمەنی (٣٣) سیوسێ ساڵیـدا نـەو بەهـاری دانابێت •

## ناوەرۆکی نـەوبەهار ( ٭ )

نـەوبەهار ، لەلایەنی ناوەڕۆکییەوە ، فەرهـەنگێکی عارەبی ـ کـوردییە ،گەرچی لە هـەندێ شوێناندا لـەم ڕێبازە لادەدات و شێوەکەی دەبێتە کـوردی ـ عارەبـی ، ئەمەش ، وێدەچێ لەبەر پێویستی کێشەکانی عەرووزی رووی دابێت •

---

(٭) بێگومان مەنتقیترە باس لە قالب و فۆرمەوە بکرێت پێش لە ناوەرۆك• بەڵام لەبەر هەندێ تێبینی، تایبەتیی خۆم بەرامبەر بە قالبەکەیەوە، ئەم پاش و پێش خستنەم ڕەوا بینی ، هیوادارم کار لە زنجیرەی باسەکـە نەکات • (دانەر)

وەك لە پێشەوەدا باسمان کرد، تێکستی فەرهەنگەکە (١٦١) بەیتی پڕ کردۆتەوە، نزیکەی (٩٠٠) نۆسەد ووشەی عارەبی بەرامبەر بەنزیکەی (٧٠٠) ووشەو زاراوی کوردی تێداهەیە٠ هەڵبەت زیادی یەکەی سەرجەمی ووشەکانی عارەبی،لەووشەکانی هاو واتا (مترادفە)وە هاتووە

جگە لەمەش، کەلێك ئەمرازی کوردی بۆلکاندنی واتاکانو بۆ دەستنیشان کردنی ووشەکانی تیادا بەکار هاتووە، وەکو (ئەورەنگ=وکذلك، ومثلە) یاخۆ (وسان=هەروەها) یان (چیە=ماذا؟) ٠

گەرچی شێوەی گشتی‌ی نامیلکەکە ، دانانی ووشەی عارەبی و کوردی بەرامبەر بەیەکترن ، جاری واهەیە ، نیوە بەیتێکی عارەبی‌ی کردووە بەکوردی وەك :

فما خطبكم ایها المرسلون := کەلی قاسیدان بۆچی هاتینەهوون

یاخود رستەیەکی عارەبی‌ی وەرگێراوەتە سەرکوردی :ــ

تعالوا سریعا = وەرن هوون ب لەز

فهذه جنة = ئەڤە هایە رەز

یا،واتای ووشەیەکی عەرەبی‌ی، بە رستەیەکی کوردی لێکداوەتەوە

زحزح= ئەی دوور بووی

ازلف = زیدی‌وی‌یە ٠

واتای ئەمچوار زاراوەی (عناصر، موالید، طبائع، أخلاط)ی دیاری کردووە!

بزان چار ن عناصر: ئاخ‌و ئاڤ‌و باوو ئاگر هەم

موالیدن ئەڤە هەر سێ : نەبات‌و مەعدەن‌و حەیوان

طبائع ! گەرمی نوساری ، زوانی نوتەری هەر چار
وەرەنگ ؛ سەفراووو سەودا بەلغەمو خوون ! پێژە ( أخلاط ) ان
کردەوەی (فعل)ی (هات)ی کوردی تەسریف کردووە، گەرچی
هەموو سیغەکانی نەهێناوەتەوە !

هاتم: اتیت • اەتی: تێم • وی هات:اتی • ایت: وەرە •

هەندێ کردەوەی عارەبیشی کردووە بەکوردی، وەك:

آتیت:منەدا • خذ:بگر • ارجع:قەتبەر • اذهب:هەرە

اجعل:بکێر • اسحق:بهێر • اضرب: بقوت • انظر:بنێر

اقرا:بخوون • اعلم:بزان • ایمان:بمەعنا باوەرە

بەرا مبەر بەهەندێ راناو (ضمیر)و ئەمراز (اداة)ی عارەبی،
ئەوانی کوردیی داناوە:

رُبَّ، ربَّما: گەلەك • ثم: لوێ • هنا: لەبر • (لێرە)

لا:نەء • لنا:ژبۆمە • ان:ئەگەرە • لِمَ: چرا

این:لکوو • کیف:کووە • تحت: لبن • علی:ل سەر

ثم : ژ پاشیوی ( بزان ) • انت : تونی • لی : بۆمەرا

علیك: لسەرتە • علیّ:ل من

علیه:لسەروی • ومنی:ژمن

علینا:لسەرمە • علیهم:لوان

علیکم : ل سەروە • خسارة : زیان

گەلێك زاراوی تریشی کردووەبەکوردی:

شارق و بیضاء : چنە ئەو؟ هەردو رۆژ

مەغریبو مەشریق چنە ئەو؟ خاڤقان

شمس و قمر : رۆژو هەییڤن برا

رۆژو هەییف هەردوو چنە ؟ ازهران

لە ژمارەشدا ،سەرڕای (سەد)و (هەزار)، لە یەکەوە هەتاوەکو (دە)ی کردووە بە کوردی •

## بابەتی ووشەکانی نەوبەهار

وەکو (خانی) بەخۆی لە پێشەکی‌ی فەرهەنگەکەیدا نیشانی داوە ، مەبەستی لە دانانی نەوبەهار یاریدەدانی شاگردانی کوردو ئامادەکردنیان بووە بۆ قۆناغە هەورازەکانی خوێندن‌و پایەی خوێندنی خستۆتە دووای تەواوکردنی (قورئانی پیرۆز) وەکو ئاشکراشە ، تێکەیشتنی واتای (قورئان) ئامانجی هەرەگەورەی رۆشنبیرانی موسلمان‌بووە ئەگەر تاکە ئامانجیان نەبوبێت ، بۆیێکە هەتا وەکو ئەم سالآنەی دووایی لە فێرگاکانی ئایینی لەکوردستاندا، شارەزابوونی زمانی عارەبی، بە(نەحوو)و (سەرف‌و) (بەلاغەت)ەوە، بناغەی خوێندنی (ئوسولی‌تەوحید)و (فیقە)و (شەریعەت)بوون • خوێندنی لقەکانی دیکەی زانیاری لەدووای ئەمانەوە دەستی پێدەکرد •

بێگومان ئەم راستی‌یەو ئەم مەبەستە کارێکی گرنگیان هەبووە، لە هەڵبژاردنی ووشە عارەبی یەکانی ناو فەرهەنگەکە • تەنانەت لەهەندی شوێناندا، ووشەکانی عارەبی، راستەو راست هەندێ ئایەتەکانی (قورئانی پیرۆز) دەستنیشان دەکەن :

**مشكاة : کولەك • نەینك : مرآة • چرا : مصباح**

**وهاج ، منوّر ، هم ، دژی : ب رۆهنایی**(٦)

**یان :**

---

(٦) کولەك = کولانکە = دەلاقە : لێرەدا مەبەستی یاریدەدانی شاگرد بوەیۆ تێکەیشتنی ئایەتی (٣٤) لە (سوورەتی نوور) (دانەر) •

موۆدە : کەچـا خـۆش دانالی دنێف فەیریّ[7]
یـا خـۆ :
نضاختان : ئەو هەردوو ئی هلدکولن ژ ئاڤێ
مدهامّتان : هەردووبین رەش بوونە ژ ئاڤدایێ[8]

رەنگە بێ هەرئەمەش هۆی ئەوە بووبێ کە زۆر ووشەی هاوواتای عارەبی بە دووای یەکتری ریز،بکات • کە بەشی زۆریان ئیستاکە لەکارکەوتوون و بەووشەی مردوو دەژمرێن ، وەکو :

ترب ، تراب ، سماد ، رمســـس ، رغام ، ثاه
عفر ، بر ، ثری :ئاخ‌و صفوان : بەرِ ( ـ بەرد )

ئەوە ئاشکرایە کە لە زمانی عارەبی‌ی ئیـمڕۆکـەدا، بۆ واتـای ( ئاخ ـ خاك )، جگە لەووشەکانی ( تراب ثری ، رغام ) ئەوانیتر بەدەگمەن بەکار دەهێندرێن • هەروەها ، ئەم بابەتە ووشـانەی عارەبی وەکو (ودق، حیا=باران)، (صفـوان=بەرد)و (حمـاء، صلصال=قوڕ) مەگەر لە فەرهەنگەکانی زمانـی عارەبـی‌و لـە کتێبەکانی هەرە کۆندا نەبێ، لەشوێنی دیکەدا بەرچاو ناکەون• سەرەڕای ئەمەش ، هەندێ ووشەی ئەوتۆی تێدا هەیە ، کـە لـە فەرهەنگی (المنجد)دا، نەمدۆزینەوە،وەك (دونض=پیواز)و ( جون ، صفرا = کەڤان ) و ئیتریش • بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا ، هێشتا بەشی زۆری ووشـە عارەبی‌یەکانـی زیندوون‌و لەکـار نەکەوتوون •

ئەو لێگرتنەی کە بەرامبەر بەووشەکانـی‌عارەبی‌یـەوە هەیـە، بەرامبەر بەووشەکانی کوردی‌ی ناو فەرهەنگەکە ، لە جێ نابێ •

---

٧ ـ سوورەتی (تکویر) ئایەتی (٧) (دانەر
٨ ـ سوورەتی (الرحمان) ئایەتی (٦٤) (دانەر

کەم وایە بەرامبەر بەووشەکانی عارەبی، لەیەك ووشەی کوردی‌ی پتر هێنابێتەوە • زۆربەی‌زۆری ووشەکانی کوردیش، هەتاکو ئێستاکە، لە هەردوو لقەکانی زاری‌کرمانجی‌دا، بەهەمان واتای ئەوساکە بەکاردەهێندرێن‌و هێشتا شێوەی درکاندن و فۆنەتیکی ئەوسایان پاراستوە •

بێگومان، درکاندنی پیتی (و) بە(ڤ): وەکو (چاو-چاڤ)، یاخۆ درکاندنی (س،ت) ی باریك، بە (ص،ط)ی، ئەستوور، وەك (تەنیشت= طەنیشت)، (سۆر=صۆر)، بەجیاوازی لقەکانی‌زاری کرمانجی ناژمرێن، ئەوەی لەم جیاوازی‌یە دەخاتەروو، چۆنیەتی‌ی نوسینیانە، کە یەکیەتی شێوەی نووسین پێکهات‌و کە ووشەی کوردی لەفەرهەنگی زمانی کوردیدا، بەپیتی راست هاتنە چەسپاندن، ئیتر چۆنیەتی درکاندنیان نابێتە هۆی جیاوازییان•

ئەوە ئاشکرایە، کە پیتی (ل) لە ووشەی (گوڵ)دا، لامێکی قەڵەوە، کەچی لەهەرێمی (دەشتی هەولێرێ)، ئەم (ڵ)ە، بە (ر)یەکی ناسکی پڕ بە دەم دەدرکێنن، دەنگەکەی لە نووشتانەوەی سەرەزمان پەیدا دەبێت • بەڵام شاعیران‌و نووسەرانی‌ئەم هەرێمە شێوەو رێنووسی ووشەی (گوڵ)یان‌نەگۆڕیوەو ناشبێ بیگۆڕن •

گوتمان زۆربەی زۆری ووشە کوردی‌یەکانی نەوبەهار، هەتاکو ئێستا لە هەردوو لقەکانی زمانی کوردیدا، بەهەمان واتای ئەوساکە بەکار دەهێندرێن‌و هێشتا شێوەی فۆنەتیکی ئەوسایان پاراستووە؛ راستی‌یەکەی هیچ کوردێکی کوردستانی باشور ( جنوبی ) ، لە خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئەم فەرهەنگە دانامێنی تەنانەت گەر شارەزای شێوەی ئاخافتنی زاری کرمانجی

باکووریش نەبێ • ئەمەش دیاردی ئەوەیە، کە بەلایەنی کەمی، لە سەدا هەشتای ووشەکانی، لە هەردوو لقەکانی زمانی کـوردیدا وەکو یەکن و هەمان فۆنەتیکیان هەیە • لەسەدا دەی ووشەکانیشن جیاوازیی شێوەی درکاندنیان رووالەتی یە وەکو ( چاو = چاڤ) (زراو=ظراڤ)، (ئەستۆ=ئەسطۆ)، (سۆر=صۆر)، تاو = طاڤ• یەکیەتی رێنووس و فەرهەنگ، لەئەنجامدا. ئـەم جیـاوازی یە ناهێلێ • ئەو ووشانـەی کە لەیەکتـر جیـاوازن. لـەسـەدا دەی ووشەکان پتر نابن، ئەمانەشـ، وەك لە هـەموو زمانەکـانـی زیندووی جیهـاندا هەیـە، بـە ووشـەی هاوواتـا (متـرادف) دەژمێردرێن وەکو (ئاخ=خاك) • (هوون=ئێوە)،(رمن=ردێن) (هری=خوری)، (هـەری=قـوڕ)، (سیه=سێبـەر)، (ستـران = گۆرانی)، (رەوال=بێئو)، (ئەستری=درك)، تۆی=پڕ) (لەز = پەلە) • هتد •

خانی، شارەزایەکی ئەوتۆی هەردوو زمانەکانی عارەبی و کوردی بووە، کە هەمیشە، بەرامبەر بە ووشەکـانی عارەبـی، ووشـەی کوردی پڕ بە پێستیانی داناوە • لێرەدا هەم بۆ نموونـە، هەم بۆ

چەسپاندنی یەکیەتیی لوکابولەبـەری زاری وێـژەی کـوردی (باکوورو باشوور)، ئەمکۆمەڵە ووشانـەی ناو فەرهەنـگەکـە، بەهەمان شـێوەی درکاندن ، بەلام بەر ێنووسی تازەوە دەخەینـە بـەرچـاو •

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| رفیق،صاحب | : | هەڤرێ |
| مالك | : | خودان |
| جاهل | : | نزان |
| علام،خبیر | : | زانا |
| مروءة | : | مێرینی |
| فتوة | : | لاوینی |
| أبوة | : | بابی |
| رعش | : | لەرزین |
| رجّ | : | هژاندن |
| سؤال | : | پرسین |
| تراخي | : | سستی |
| ترف | : | نەرمی |
| سمن | : | روون |
| سمین | : | قەلەو |
| شحم | : | بەز |
| عضد | : | بازك |
| مرفق | : | ئەنیشك |
| جنب | : | طەنیشت |
| ابط | : | بنچەنگ |
| حلق،حنجرة | : | گەوری |
| صفر | : | مەفرەق |
| نحاس | : | پاخر |

| | | |
|---|---|---|
| رصاص | : | قــەلا |
| روضه | : | چیمەن |
| جنة، بستان | : | رەز |
| لواء | : | ئالا |
| علم | : | نیشان |
| امتلاء | : | تژی (بوون) |
| مشحون | : | تژی |
| خاوی | : | قالا |
| عالی،سامی | : | بلند |
| راکب | : | سوار |
| ر اجل ، ماشی | : | پەیا |
| موت | : | مرن |
| میتة | : | مراو |
| بصر | : | دیتن |
| بیع | : | فرۆتن |
| شراء | : | کرین |
| عطاء | : | دان |
| عرش | : | بان |
| أیکة | : | بیشه |
| ربع | : | ئێورگه |
| شق | : | کەلاشتن |
| حزمة | : | گورز |
| أبلد | : | کەودەن |
| حمیة | : | پاوان |

| | | |
|---|---|---|
| ظرف،وعاء | : | تامان |
| تكية | : | پال |
| متكا | : | پالگه |
| مرفقه | : | بالگه |
| شكاية | : | گلی |
| عدالة | : | بەرابەر |

لە کۆمەڵە ووشـەکـانی پێشـەوەدا، دووانیـان زۆر سـەرنـج رادەکێشن‌و پایەی بڵندی (خانی) لە زمانەوانیدا دیاری دەکـەن، ئەمیش ووشەکانی(پالگه)و(بالگه)ن، کەلەووشەی (پال)و (بال)ی داتاشیون ، سـەرەڕای ئەمانەش کۆمەڵێك ووشـەی ئەوتۆی بـۆ چەسپانـدووین ، کـە سـامانێکی گـرانبەهای فـۆکابـولەری‌ی زمانەکەمانن بڕ لە ورووژان‌و لە هەواڵی دەروونی‌ی مرۆڤ‌دەکەن:

| | | |
|---|---|---|
| خلة،محبة | : | ئەڤین |
| بغض ، عداوه | : | نەڤین |
| انس،الفة | : | هۆگری |
| انفعال | : | شەرم |
| ضغن | : | کین |
| غيظ،كرب | : | غەم |
| فرح | : | شامی |
| روح | : | هێسـانایی |
| امل | : | هیڤی |
| كلوح ، عبوس | : | رووترش |
| اشارة ، وحي | : | ڤی |

| | | |
|---|---|---|
| قدرة | : | تين |
| زيغ | : | ميل |
| تلذذ | : | خوشي |

بەلام هەندێ جار، خانی، بەرامبەر بە ووشەی عارەبی، ووشەیەکی ئاسانتری عارەبی هێناوەتەوە، نەك ووشەیەکی کوردی • وەك:

**(سلطان = دليل)، (عقاب، نكال= عەزاب)، (بهاء=زینەت)، ( سجیة - تەبیعەت ) ئەمەش یالەبەر پێویستی کێشی هۆنراوەبووە یاخۆ ووشەی کوردی‌ی بەرابەریانی نەدۆزیوەتەوە •**

## قالبو فۆرمی نەوبەهار

وەکو بزانم ئەم لایەنەی (نەبەهار) تاوەکو ئێستا خراوەتە پشت گوێ یاخود من ئەو باسانەم نەدیوە کەلەم بارەوە نوسراون• بێگومان پێش‌لە ئیسلام بوونی نەتەوەی کورد زمانی کوردی لەبەستەو گۆرانی یان لە ئاوازەی مۆزیقایی بێ بەش نەبووە • زۆر بەدڵنیایی دەتوانین هەموو کێشە گرانەکانی (بەیت‌و لاوکو حەیران ) بە پاشماوەی کێشەکانی داستانی (مەلحەمی) کۆنینە لە قەلەم بدەین‌و کێشە سووکەکانی بەستەو گۆرانیش،، کە لە سەر بنچینەی برگەی دەنگی ( syllable ) دامەزراون بە کێشەکانی نەتەوەیی شیعری کوردی بزانین • ئەم کێشانەش، چونکە زادەی زمانی کوردی‌و سروشتی‌مۆزیقی‌ی نەتەوەی‌کوردن، نەك هەر هەبوونی خۆیان پاراستوە ، بەلکو جێگەیان بەکێشەکانی عەرووزی (عروضی) لەق کردووەو خەریکن بۆ یەکجاری مەیدانی شیعری کوردی داگیر بکەنەوە •

دووای ئیسلام بوونی نەتەوەی کوردو بلاو بوونەوەی رۆشنبیـری ئیسلام لەکوردستاندا، نەتەوەی کوردیش ،وەك نەتەوەکانیتروازی لـە گەلێك کەلەپووری گیـانیی پێش ئیسـلامەتیی هێناوەو ، کێشەکانی نەتەوەییشی مەیدانیان بۆ کێشەکانی عەرووزیی چـول کردووەو بوونەتە کێشی فۆلکـلۆری • تەنانەت ئـەو شـاعیـرە نەخویندەوارانەی کەلەسەر ئەمکێشانە شیعریان داناوەبە(شایەر) ناو نراو ن نەك (شاعیر)• ئەوەش ئاشکرایە کە پایەی هۆنەریی (شایەر) بەپێی کێشانەو تەرازووی سەردەم، لە پایەی (شاعیـر) گەلێك نزمتر بووە •

گەرچی شاعیرە گەورەکانی پێش (خانـی)و دووای ئـەمیشـ، هەموویان شـاعیری عەرووزی بوون و هونەرێکی زۆریـان لـەم بارەوە نواندووەو ، لەگـەڵ ئەوەی کـە هەتا رۆژانی ئیمرۆمـان کێشەکانی عەرووزی لەلایەن گەلێك شاعیرانی کوردەوە پێرەوی دەکرێن ،وەکو بزانم هیچ باسێکی نەزەریی ئەوتۆلەبارەی‌زانیاری

**عەرووزەوە لە زمانەکەماندا نیە • ئەمجا لێرەدا نرخی هونەریی نەوبەهارمان بۆ ئاشکرا دەبێت •**

راستە نەوبەهار باسێکی نەزەری نیەو ،تەنانەت قالب‌وفۆرمەکەی زیانیان بەناوەرۆکی فەرهەنگەکە گەیاندووەو، دوورنیە گەرلە قالبی هۆنراودا نەبوایە ، هەم لەوارەکەی گەورەترو هەم چـەند

ئەوەندەی دی ووشـەی کوردی تێـدا هـەباو خزمەتێکـی پتـری زمانەکەمانی بکردایە •

بەڵام مەبەستی‌خانی پەروەردە کردنی منداڵانی کوردبووە• بەهۆی ئەوەی کە شاعیرێکی گەورەو رابەرێکی ئێجگار دووربین بووە ،

نرخی هونەری شیعری بەتەواوی زانیوەو وێستوویەتی بنچینەی ئەم هونەرە کە کێش و مۆزیقایەتی ، روون بکاتەوەو هەر لە منداڵی‌یەوە . شاگردانی کوردفێری ئەو کێشە عەرووزی یانە بکات کە بۆ دانانی شیعرو هۆنراوەی کوردی بەکار دەهاتن .

**بۆیەکە ، مەتنی فەهەنگەکەی لەسەر سێزدە کێشی عەرووزی هۆناندۆتەوەو ناوی کێشەکان و تەفعیلەکانی دیاری کردووە . ئەمەش بە باوەڕی من یەکەمین هەوڵدان بووە کە لە لایەن شاعیرێکی زانای کوردەوەدراوە لەبارەی زانیاری عەرووزەوە**

زانستی عەرووز (علم العروض)یش ، لە بنەڕەتا ئەو زانستەیە کە بنچینەی کێشەکانی شیعری عارەبی روون دەکاتەوە.(ئەحمەد کوڕی خەلیل فەراهیدی) لە سەدەی دووەمی کۆچیدا لە شوینێکی بە ناوی (عَروض) ، لە شاری (مەککە) ،بناغەی ئەم زانستەی دامەزراندوە بۆ یێکە ناوی زانیاری عەرووزی لێناوە . ( ٩ )

هەرووزیش شازدە بەحری هەیەو ئەمانەن : ( ١ ــ الطویل .
٢ــ الکامل . ٣ــ الرجز . ٤ــ البسیط . ٥ــ الوافر .
٦ــ المتقارب . ٧ــ الخفیف . ٨ــ الرمل . ٩ــ المدید .
١٠ ــ السریع. ١١ ــ المنسرح. ١٢ ــ المجتث. ١٣ ــ الهزج.
١٤ــ المضارع . ١٥ــ المقتضب ١٦ــ المتدارك[١٠]

هەریەکێك لەم بەحرانەش، لەچەند تەفعیلەیێکی ئەم هەشت تەفعیلانەوە دروست دەبن

**( فعولن ، مفاعیلن ، متفاعلن ، مستفعلن . فاعلن**

---

٩ ــ توضیح العروض ص٥ . امیل جورج عبید .
١٠ ــئەم بەحرە (ئەخفەش) دۆزیوەتیەوە . (هەمان‌سەرچاوە ) .
تێبینی : بۆ نووسینی ئەم باسە سوود لە کتێبی (توضیح العروض) وەرگیراوە .

مفاعلتن ، فاعلاتن ، مفعولاتُ . ).

بەشی زۆری بەحرەکان . دوو بابەتیان هەیە، بابەتی تەواو (تام)و بابەتی مەجزووء . بۆ نموونە:

لەبنەڕەتا، بەحری (رەجەز) لە شەش تەفعیلەی (مستفعلن) پێکهاتووە:

مستفعلن مستفعلن مستفعلن ( دووجار )[11]

کەلەم بەحری تەواوە تەفعیلەك کەم دەبێتەوە، بەحرەکە دەبێتە رەجەزی مەجزووء:

مستفعلن مستفعلن (دووجار)

هەر تەفعیلەیەکیش لەچەند سەبەب ( سبب ) و وەتەدو ( وتد ) فاسیلە (فاصلة) دروست بوون . هەریەکێلەم سێیانەش لەچەند پیتان پێکهاتوون . پیتەکانیش هەندێکیان بزیون ( متحرك ) و هەندێکیان نەبزێون (ساکن). تیپی بزێویش یەکێکلەم سێ نیشانانەیهەیە ( سەر= فتحه ) ( ژێر ـ کسرة ) ( بەر=ضمة) تیپی نەبزێویش هەمیشە نیشانەی ( زەننە = سکون ) ی بەسەرەوەیە . لەبەر ئەوەی کەلە ڕێنوسی کوردیدا نیشانەکانی بزووتن بەکار نایەن و سەیارەت بەوەی کە زانستی عەرووز تایبەتی شیعری عەرەبییە بەچاکتری دەزانم کەلەزەمینەی ئەم باسەدا هەمان میسالەکانی سەرچاوەکانی عەرووزی عارەبی بکەم بەنموونە .

**یەکەم : سەبەب : لە دوو پیتان دروستبووەو دو جۆری هەیە :**

١ـ سەبەبی گران ( السبب الثقیل): ئەوەیە هەردوو پیتەکانی بزێوبن وەك (لَهُ)

---

(١١): مەبەست لە دووجار ئەوەیە کە(بیت)ەشیعرەك دەبێتە ٦ تەفعیلە، چونکە لە دوو دێرە شیعر (مصراع) پێکهاتووە . (دانەر)

٢ ـ سەبەبی سووك ( السبب الخفيف ) : ئەوەیە پیتی یەکەمی بزێو بێت و ئەویتر نەبزێو ، وەك ( قَبْ ) ٠

## دووەم: وەتەد: لەسێ پیتان پێکهاتووەودوو جۆری هەیە:

١ـ وەتەدی کۆوەکراو (الوتدالمجموع): لەدوو پیتی بزێوو یەکیکی نەبزێو دروست بووە ، وەك ( نَعَمْ ) ٠

٢ـ وەتەدی دابڕاو (الوتد المفروق):لە پیتێکی بزێوو پیتێکی نەبزێوودیسان پیتێکی بزێوەوە پێکهاتوەو ، وەك ( قالَ ) ٠

## سێیەم: فاسیلە: دووجۆری هەیە

١ ـ فاسیلەی بچووك ( الفاصلة الصغرى ) : لە سێ پیتی بزێوو یەکیکی نەبزێو دروست دەبێ وەك : (سَكَنُوا ) ٠

٢ـ فاسیلەی گەورە (الفاصلة الكبرى): لە چووار پیتی بزێوو پیتێکی نەبزێو پەیدا دەبێ وەك ( قَتَلَهُمْ ) ٠

ئەمەیان لە لایەك:

لەلایێکی کەوە ٠ هەر تەفعیلەیەك بۆی هەیە دوو جۆرە گۆڕانی بێتە سەر ٠ یەکەم (زحاف)و دووەم (علة) ٠

**( زحاف ) یش واتای کەم کردنەوەیەو تووشی سەبەبەکان دەبێت و دووبابەتی هەیە:**

١ـ زحافی تاك (الزحاف المنفرد) : کە ئەمانەن (الخبن ـ الوقص ـ الاضمار ـ الطي ـ القبض ـ العقل ـ العصب ـ الكف ) ٠

٢ ـ زحافی جووت ( الزحاف المزدوج ) ، کە ئەمانەن :
الخبل ـ الخزل ـ الشكل ـ النقص ) ٠

**عیللەتیش دووبابەتی هەیە :**

عیللەتی بەزیادی ( العلة بالزيادة ) ، کە ئەمانەن ( الترفيل ـ التذييل ـ التسبيغ) ٠

٢ ـ عیللەتی بەکەمی ( العلة بالنقص ) : کە ئەمانەن (الحذف ـ

القطف- القصر- القطع- التشعيث- الحذذ- الصلم- الكشف- الوقف - البتر ) هەروەها ئەمانەش الخرم -الخزم - الثرم - الشتر الخرب - العصب - القصم - الجمم - العقص ) •

لەمەدا ئەوە روون دەبێتەوەکەلە شازدە بەحرە ئەسلیەکانی عەرووزی چەند ئەوەندەیتر کێشی جەوازی پەیدادەبن •

وەك لەپێشەوەدا گوتوومانە، ناو ئاخنی (نەوبەهار)،لە سێزدە پارچەدا هۆنراوەتەوە• بەڵام وانەبێ هەر سێزدە پارچەکان لەسەر سێزدە بەحری ئەسلیی عەرووزی داندرابن ، بەلکو لەسەر حەفت بەحری ئەسلی و لەسەر شەش کێشی جەوازی رێکخراون کێشەکانی جەوازیش، لە هەندێ بەحرەکانی ئەسلییەوە داهاتوون • ئەمانەش کێشەکانی پارچەکانی نەوبەهارن:

**یەکەم: لەبەحری هەزەجی تەواودا :**

١- کێشیهەزەجی مەکفووفومەحزوفو موسەممەن (مثمن)١٢

٢- کێشی هەزەجی ئەخرەبو موسەممەن

٣- کێشی هەزەجی سالیمو موسەممەن •(١٣)•

**دووەم: لەبەحری رەجەزدا:**

١- کێشی رەجەزی سالیمو موسەممەن

---

١٢ - ئەوەیە بەحرەکەی ئەسلی لە شەش تەفعیلە پێکهاتبێ‌و دوو تەفعیلەی بۆ زیاد بکرێت دەبێتە هەشت تەفعیلە • (دانەر)

١٣ - بەیتەك شیعری عارەبی دوو کەرت (مصراع)ە•کەرتی یەکەم(صدر) ی دووەم (عجز) • دووا تەفعیلەی (صدر)یێ‌دەگوترێ(عروض) دووا تەفعیلەی (عجز)یش ، (ضرب) • لە شیعری عارەبیدا بۆی هەیە کە ( عروض ) و (ضرب ) گۆڕانی جیاوازیان بێتە سەر • کەچی لە شیعری کوردیدا ، ( عروض و ضرب ) یەك جۆرە گۆڕانیان دێتە سەر • ئەمجا واتای (سالم) ئەوەیە کە تەفعیلەکانی (عروض و ضرب) تووشی هیچ گۆڕانێك نەهاتبن •

٢ـ کێشی ڕەجەزی مورەفقەل • (١٤)
٣ـ کێشی ڕەجەزی مەتویو موسەممەن
٤ ـ کێشی ڕەجەزی مەتوی و مەخبوون
**سێیەم: لە بەحری ڕەمەلدا:**
**١ـ کێشی ڕەمەلی مەقسوورو موسەممەن**
٢ـ کێشی ڕەمەلی مەحزووف •
**چوارەم : لە بەحری موزاریعدا :**
کێشی موزاریعی ئەخرەب
**پێنجەم: لە بەحری سەریعدا:**
کێشی سەریعی مەتویو (مەکشوف)• ١٥
**شەشەم: لە بەحری بەسیتدا:**
کێشی بەسیتی مەتوی •
**حەوتەم: لە بەحری موتەقاریبدا:**
کێشی موتەقاریبی مەقسوور •

## لێکدانەوەی کێشـەکان

وەکو لە پێشەوەدا باسمان کردووە ، (خانی) هەر پارچەیەکی بە دوو بەیتە هۆنراوەی سەرەتایی دەست پێکردووە، تیاداکێشی پارچەکەو تەفعیلەکانی دیاردە کردوە • لە دوای ئەمەو ، لەسەر قافیە (سەروا)یەکی جیاوازدا، مەتنی فەرهەنگیی پارچەکەیهۆناندۆتەوە • لێرەدا ، ناوی پارچەکان وەك خۆی بەهارەبی دەهێلینەوە • بەڵام هەر پارچەیەك ژمارەیەکی دەخەینە پێش •

---

١٤ ـ وەك لە شوێنی خۆیدا روونی دەکەینەوە • ئەو کێشەی کە خانی ئەم ناوەی بۆ داناوە ، کێشێکی ( دە ) برگەیی کوردییەو کێشی هەرووزی نیە •

١٥ ـ وەك لە شوێنی خۆیدا روونی دەکەمەوە دەبێ ناوی تەواوی کێشەکە (سەریعی مەتوی و مەکشوف) بێ نەك (سەریعی مەتوی) • دانەر

١ ـ القطعة في بحر الهزج المكفوف المحذوف

حەتا تو دەورو دەرسان نەکی تکرارو مەسروف
دەدنیایی تونابی نە مەشهور نە مەعروف

مفاعیلُ فعولن مفاعیلُ فعولن

چ خۆش وەزنە بیتن هەزەج مەکفووفو مەحزووف

لە دووای ئەم سەرەتایە ، سەر گوزشتەی پێغەمبەری لە پارچەیەکی یازدە بەیتیی هاو قافیە (سەروا) داهۆناندۆتەوە:

خودی : الله • قاسید : رەسولە • ئەی خودی زان
(خەلیفە چارن) هەرچار ئیمامن ئەی موسلمان

لێکدانەوەی کێشەکە:

بەحری هەزەج لە بنەڕەتا کەرتی ( مصراع ) هەر بەیتێکی سێ تەفعیلەیە :

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

کەچی لێرەدا هەر کەرتێکی کراوە بە چوار تەفعیلەو کێشەکە بووەتە موسەممەن :

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن
١ ٢ ٣ ٤

ئەم تەفعیلەیەش لەوەتەدێکی کۆوەکراو (قفا) ولەدووسەبەبی سووك ( عیـ ) و ( لُـنْ ) دروست بووە •

١ ـ تەفعیلەکانی یەکەمو سێیەم تووشی زیحافی ( کەف ) هاتوون، واتا پیتی نەبزێوی (نْ) لەسەبەبەسووکەکانی (لُنْ) دا هەلگیراونو تەفعیلەکان بوونەتە ( مفاعیلُ ) •

٢ ـ تەفعیلەکانی دووەمو چوارەم تووشی عیللەتی ( حەزف ) هاتوون: واتا : سەبەبە سووکەکانی ( لن ) لەهەردوو تەفعیلەکاندا بەتەواوی هەلگیراونو تەفعیلەکان بوونەتە (مفاعی)، ئەمەش بەهۆی گرانیی لەسەر زماندا ، کراوە بە ( فعولن ) •

مفاعیل فعولن مفاعیل فعولن
که واتاتەفعیلەکانی کێشی (هەزەجی) مەکفووف‌ومەحزووف ئەمەیە :
مفاعیلُ فعولن مفاعیلُ فعولن
نەك : ٥٥
مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن
رەنگە ئەم هەڵەیە لەلایەن ئەو کەسانەوە کرابێت کە ئەوبەهاریان دەستنووس کردۆتەوە ٠
٢ ـ القطعة في بحر الراجز المطوي المخبون :
پەردەکو رابیتن ژبەر عاریزی دلستانی خۆش ١٦
دل ژ غەمان کو بێتەدەر بولبولی گولستانی خۆش
مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن
بەحرا رەجەز کو خەبن و تەی گەربیتن رەوانە خۆش
لەدووای ئەم مەتلەعە، تێکستی فەرهەنگی پارچەکە، لە سێزدە بەیتی هاوسەروادا (قافیەدا) هۆنراوەتەوە :
زوج، رجل، چ:مێر ٠ ئو ٠ ژن: مراة، زوجة،نساء
والد:بابە ٠ والدة:دایە ٠ شقیق‌واخ :برا
ابن:کوڕە ٠ بنت:کچە ٠ صهر:خەزوورە ٠ مامە:عم
عمة:مەتە ٠عمامة:شاش ٠ جدة:چیە: خۆ،پیرەدا
لێکدانەوەی کێشەکە:
بەحری هەزەجی ئەسلی هەرکەرتێکی سێ تەفعیلەیە:
مستفعلن مستفعلن مستفعلن
کەچی لێرەدا ، هەر کەرتێك تەفعیلەیەکی زیادی خراوەتەسەر و کێشەکە بووە بەموسەممەن:
مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن٠
١ ٢ ٣ ٤ ٥٥٥٥٥٥

---

١٦ ـ عاریز = (عارض) = روو ٠

هەرتەفعیلەیەکیش لەمانە ؛ لە دوو سەبەبی سووك (مُسْ)و ( تَفْ ) و لە وەتەدێکی کۆوەکراو ( عِلُنْ ) پێکهاتووە ٠

١ ـ تەفعیلەکانی یەکەم و سێیەم، تووشی زحافی(تەی) هاتوون و واتا : لەسەبەبە سووکەکانی ( تَفْ )دا، پیتی نەبزێوی رفْ) هەلگیراوەو تەفعیلەکان بوونەتە (مستعلن)ئەمەش لەبەرگرانی کراوە بە (مفتعلن )

٢ ـ تەفعیلەکانی دووەم و چووارەم تووشی زحافی (خەبن) هاتوون؛ واتالەسەبەبە سووکەکانی پێشەوەدا (مُسْ )، تیپی نەبزێوی ( سْ) هەلگیراون و تەفعیلەکان بوون بە (متفعلن) ئەمەش لەبەر گرانیی دەکرێتە (مفاعلن)٠ بەم جۆرە کێشی رەجەزی مەتویو مەخبون و موسەممەن پەیدابووە ٠

٣ ـ القطعة في بحر الرمل المحذوف :

عارفێ کو ب قنجیێ مەعرووف بت
دێ حەلیم و صابرو مەوقووف بت
فاعلاتن فاعلاتن فاعلات (١٧)
وەزن ئەڤە حینا رەمەل مەحزووف بت

دووای ئەم سەربەندە، تێکستیی فەرهەنگیی پارچەکەی لە سێزدە بەیتی هاوسەروا (قافیە)دا رێکخستووە:

ظل ، تبتع ، ڤێ : سەهن وەشەمس : تاف
دەشتە : بیداء : مشی : چوونە : خطوة : گاڤ

---

١٧ ـ دەبێ تەفعیلەی سێیەم (فاعلن)بێت یا (فاعلان) ، نەك (فاعلات) ، ئەگینا کێشەکە دەبێتە (رەمەلی مەقسوور) نەك (مەحزووف) ٠ شایانی باسە کە (منطق الطیر)ی فەریدوددین عەتتار ) و ( مەسنەوی مەعنەوی ) ی ( مەولانا جەلالوددین لە سەر ئەم کێشەن ٠ ( دانەر ) ٠

نــار : ئــاگــر : حز : گەرمــی : بــرد : صــار
ثلج : بەرفە : ماءوسلسل :هەردوو ، ئاف
تــاد ٠٠٠٠

روون کردنەوەی کێشەکە :

تەفعیلەکانــی ئەسلیی ئــەم کێشــە بــەم جــۆرەی خوارەوەن :ــ
فاعلاتــن فاعلاتــن فاعلاتــن ( بۆ هەر میسراعیك )
٣ ٢ ١

ئەم تەفعیلــەیەش لەوەتەدێکــی دابــڕاو ( فاع ) ولەدوو سەبەبی سووك (لا)و (تن) پەیدا بووە ٠

ئەگەر تەفعیلەی سێیەم تووشی عیللەتی (حــەزف) ببێــت، سەبەبی (تن) بە تەواوی لەناو دەچێو تــەفعیلەکە دەبــێتە ( فاعــلا ) ئەمەش لەبەرگرانــیی لەدرکاندنــدا دەکرێتــە ( فاعلن ) ، کێشەکەش دەبێتە رەمەلی مەحزوف ٠

خۆ ئەگەر تەفعیلەکەی ناوبراو تووشی عیللەتی ( قەسر ) بێ ئەوا پیتی نەبزێوی ( نْ ) لەسەبەبی ( تُن ) دا دەفەوتێتو پیتی ( ت ) ی بزێوەکەشی دەکرێت بەنەبزێو ( تْ ) تەفعیلەکەشی دەبێتــە ( فاعــلاتْ) ، یا ( فاعــلانْ ) ناوی کێشەکــەش دەبێ بــە ( رەمەلــی مەقسور ) ٠

وادیارە دیســان لە دوای ( خانــی ) ئەم هەلەیــە کــراوەو تەفعیلەی سێیەم لەجیاتی ( فاعلن ) ی مەحزوف بنوسرێتەوە ( فاعلات ) ی مەقسور نو سراوەتەوە ٠

٤ـ القطعة في بحر الرجز السالم المثمن ٠

کــەردێ تــە مــەقســودەك هەبــێ لازم دقــێ لێ بــی ب لــەز
خەسماتە مەعبودەك هەبــی دائم د ئەمــری وی بــەز

مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن
سالم موسەممەن هەرئەڤە ئەی تالبی بەحرا رەجەز

دووای ئەم سەرەتایە تێکستی فەرهەنگـی‌ی پارچەکە لەنـۆ بەیتی هاوسەروادا هۆنراوەتەوە :

**هاتم : آتیـت : اءتی : تێم : وی‌هـات : آتی : ایسـت : ومرە**
**آتیت : منڈا • خـذ بگر • ارجـع : فەگـەڕ • اذهـب : هەڕە**
**اجعـل : بگێڕ • إسحـق : بهێڕ : أضـرب بقوت • انظر : بنێـڕ**
**إقـرا : بخـوون • إعلـم : بزان • إیمـان : بمەعنـا : بـاوەڕە**

لێکـدانـەوەی کێشەکـە :

بەحـری رەجەزی تـەواو لە بنەڕەتـا لـە شەش تەفعیلـەی ( مستفعلن ) داهاتووە واتا میسراعی هەر بەیتێکی سێ تەفعیلەیە کەچی لێـرەدا هەر میسراعێـك تەفعیلەیەکـی زیادی خراوەتـە سەروکێشەکە بووە بە هەشـت تەفعیلەیـی • ئاشکراشە کـە تەفعیلەکان هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتووە •

**٥ ـ القطعة في بحر الرجز المرفل •**

هەرچی ب علمێ جەهل‌کر موبەددەل
سفرێ خۆوی کر ب زێڕ موکەللەل
**مستفعـلاتـن مستفعـلاتـن**
**بەحرا رەجەزبوو چ خۆش مورەففەل**

لـە دووای ئەم سەربەندە مەتنـی فەرهەنگـی‌ی پارچەکـە لە پێنج بەیتی هاو سەروادا رێکخراوە :

**اخضر چە : کەسکە • احمر ، خۆ : سوورە**
**ازرق : هشینە • جورب ، چە:گۆرە**
**طود ، جبـل ، طور : هەرسـێ : چیانـــە**
**وادی : نەوالە • حفرة ، چە کۆرە = ( قوورت ) •**
**مرسول : هناری • ملفون : فەشاری**
**مجبور بێگاف • مجبر : بزۆرە**
**ابکم : چەلالە • اعرج : چە : لەنگە**

یەك چاڤە : اعور ٠ اکمه : خۆ کۆرە ( = کوێر ) ٠
مقتول: کوشتی ٠ مغسول:شەووشتی
میتة : مرارە ٠ مرقد ، حو :کۆرە
راستی یەکەی،چۆنیەتیی داهاتنی ئەم کێشەلەبەحری رەجەزدا بۆم ساغ نەکرایەوە ٠ چونکە تەفعیلەکانی بەحری رەجەز تووشی عیللەتی ( تەرفیل ) نابن ٠
بەلام ئەوە ئاشکرایەکە ئەم کێشە ، کێشەکی دەبڕگەیی نەتەوەییمانەو زۆر لە گۆرانییەکانی فۆلکلۆری کوردیلە سەرئەم کێشەن ٠ لاموایە (خانی) بۆ ئەوەی پایەی کێشەکە لەلای شاعیرەکانی کورد بەرز بکاتەوە ئەم (تەخریج)ەی بۆ کردووە، یاخۆ باوەڕی وەهابووە کە دەبێ هەموو کێشێکی شیعری لە بەحرەکانی عەرووزییەوە داهاتووبن ٠ (١٨)

٦ ـ القطعة في بحر المضارع الاخرب ( ١٩ )

تەی کوتە کیبر دائیم کرییە ژ بۆ خۆ مەرکەب
ئەووەل توپی بکەیی پاشی بگیرە مەرکەب (٢٠)
مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن

خۆش وەزنەبێ مەلالە گەر بت موزاریع ئەخرەب
دووای ئەم مەتلەعە مەتنی فەرهەنگیی پارچەکە نۆ بەیتی

---

١٨ ـ بناغەی مۆزیقایی کێشەکانی نەتەوەیی کوردی ٠ لەسەر بڕگەی دەنگەوە دامەزراوە نەك پیتی بزێو و نەبزێو (المتحرك والساكن) ٠ ئەمەش جیاوازییەکی زۆرکرنگە ٠ چونکە هەر بڕگەیەکی دەنگیی کوردی، ج سوك بێت وەك (دوو ـ دزەدێ ٠٠ تاد ٠ )و ج ناوەنجی بێ وەك (دار، دەر ، دلێر ٠ تاد ٠ )و ج گران بێ وەك دەنگ،خوێن، بەرگ ـ تاد ٠ ) نرخەکەی مۆزیقیی لەهەموو بڕگەکەدایە نەك لەپیتەکاندا ٠ (دانەر)
١٩ ـ لەچاپەکەدا (الاحزب) نووسراوە، دیارە ئەمەش هەڵەیە ٠ (دانەر) ٠
٢٠ ـ لام وایە ئەم بەیتە پێویستی بە ساغکردنەوە هەیە ٠ لە فەرهەنگی (المنجد)دا ، واتای المرکب ، بەم جۆرەیە (المرکب : واحد المراکب البحرية اوالبرية)(رکب،رکوبا،ومرکبا الدابة،وعلى الدابة) ٠ دانەر

